# بەسەرهاتی هەڵەکەی پێغەمبەر داود عليه السلام

بەسەرهاتێکی مەشهورە لای سەلەف و لە کتێبەکانی ئەسەر و تەفسریەکانی سەلەفدا دەربارەی وتەی الله کە دەفەرمووێت : ( وهل أتاك نبأ الخصم إذ تسوروا المحراب) هەندێک لە ئەهلی تەفسیر ڕەتیان کردوتەوە بەتایبەت موتەئەخرین ، بەهۆکاری شوبهەی عصمەوە ، پاشان وەک هەموو شتەکانی دی جاهیلە کاڵ فامەکان کاتێک ئەقڵیان نایگرێت دەڵێن : ئیسرائیلیاتە.

بەم جۆرە هاتوە : لە إبن عباسەوە رضي الله عنه دەڵێت : داود عليه السلام لە نەفسی خۆیدا وتی : گەر من تاقی بکرێمەوە ئەوا سەرکەوتوو دەبم و پارێزراودەبم ، بۆیە پێی وترا ئەی داود کەوابوو تۆ تاقی دەکرێیتەوە ، تۆ بزانە کە ئەمرۆ تاقی دەکرێیتەوە لە ئامادەباشیدابە.

پێی وترا : ئەمرۆ تۆ تاقی دەکرێیتەوە و ئەویش زەبوری هەڵگرت ( بریتیبوو لەو کتابەی الله بۆی ناردبوو ) چوە شوێن نوێژ و عیبادەتی خۆی کە جێگایەکی بۆ تەرخان کردبوو وە دەرگاکەشی داخست وە زەبوری خستە کۆشی و لە ناوەراست دەرگاکە وەستا و وتی : ئەمرۆ ڕێگا مەدەن هیچ کەس بێتە لای من ، لەوکاتەدا خەریکی خوێندنی زەبور بوو باڵندەیەکی زۆر جوان هاتە لای کە لە جوانیدا کەم وێنەبوو ڕەنگاوڕەنگ و تابلێی جوان نزیک بویەوە لێی ویستی بیگرێت لەدەستی دەرچوو چویە جێگایەکی بەرز لە میحرابەکە ، داود لێی نزیک بویەوە تا بیگرێت دیسان فڕی و بۆی نەگیرا ، داود عليه السلام تەماشای کرد تابزانێ لەکوێ دەنیشێتەوە ، کاتێک تەماشای کرد چوە تەنیشت ئافرەتێک و لەوێدا وەستا ئافرەتەکە خۆی دەشۆرێت (خۆی دەشوشت) ، کە لە جوانیدا کەم وێنە بوو زۆر سەرنجی ڕاکێشا ، کاتێک ئافرەتەکە سێبەری داودی

بینی سەری جوڵاند و بە قژی جەستەی داپۆشی ، داودیش زیاتر پێی سەرسام بوو ، وە خێزانی ئەم ئافرەتە لە جیهاد بوو لە پێناوی الله سبحانە و تعالی .

داود نوسراوێکی نوسی بۆ سەرکردەکانی غەزاکە ، کە سەرکردەی جەیشەکە خوشکەزای داود خۆی بوو علیه السلام ، فەرمووی لە نوسراوەکە : کە مێردی ئەم ژنە بخەنە پێشی موجاهیدان تابکوژرێت و نەگەڕێتەوە ، دوای چەند جارێک قەدەری الله نەدەکوژرا و ئـەو جێگایەکەی فەتـح دەکرد کـە پێـی سپێردرابوو تاوەکو لـە جاری سێیەم دا کوژرا.

کاتێک عیدەی ئافرەتەکە تەواو بوو داود علیه السلام چوە داوای ئەم ئافرەتە و زەواجیان کرد ، ئافرەتەکەش کردیە مەرج کە ئەگەر هاتوو کوڕێکی بوو لە داود بیکاتـە جێنشینـی خـۆی لـە دوای خـۆی ، وە پەنجا کەسـی کـرد بـە شاهید بەسەریەوە لـە بەنـی ئیسرائیل ، وە کتابێکـی نوسی وەک عەقدێک لە نێوان ئەم ئافرەتە دواتر پێغەمبەر سولەیمانی لێبوو علیه السلام واتە دایکی سولەیمانە.

دواتـر دوو مەلائیکە دابەزیـن و باسـی بەسەرهاتـی خۆیان بـۆ داود کرد بۆ ئەوەی داود تێبگات کـە چ هەڵەیەکـی کردوە ، یەکیان وتـی مـن یەک مەڕم هەیە ئەم برامە دەیەوێت ئەوەی من ببات بۆ خۆی لە کاتێکدا خۆی ٩٩ مەڕی هەیە ، ئەوی دیش وتی : من ٩٩ مەڕم هەیە دەمەوێت ئەوەی ئەویش ببەم بۆ خۆم تا ببێت بە ١٠٠ ، داود فەرمووی : تۆ مافی ئەوەت نیە شتی وا بکەیت دەنا سزات ئـەدەم ، دواتـر بەداودی ووت : پێویستە تـۆ سزابدرێیت نەک ئێمە ، لـە کاتێکدا تۆ ٩٩ هاوسەرت هەبوو بەڵام أوریا کە مێردی ئافرەتەکە بوو تەنها یەک هاوسەری هەبوو ، تا بەکوشتت دا و خۆت هاوسەریت مارە کردەوە ، ئەو کات دوو بـراکە نەمـان و داود علیه السلام زانـی مەلائیکە بـوون و ئەوە تاقیکردنەوە

و بەئاگاهاتنەوەبوو بۆ ئەم ، دواجار داود بە تاوانەکەی خۆی زانی و بە گریانەوە سوجدەی برد چل ڕۆژ ، الله ــش لێی خۆشبوو.

(المصنف لإبن أبي شيبة - ٣١٨٩٤) ، (ابن أبي حاتم - ١٨٣٤٣) .
(الطبري - ٢٣/١٤٦) ، (ابن ألأعرابي في معجمە - ١١٤ ) و البغوي في تفسيره ، و السيوطي في الدرر و غيرهم).

هەواڵــی بەسەرهاتی داود عليه السلام زۆرە لەسەر زوبانی تابعین و أتباعی تابعینیشەوە ، لــە ســەلەف لەبەر زۆرییان ناتوانیــن هەمــووی بەیان کەیــن بۆیــە هەندێکی دەخەینەڕوو لە کتابەکانی سەلەفدا لەوانە : (مجاهد بن جبرالمكي عند ابن أبي شيبة في المصنف - ٣١٨٨٨) ، (هناد بن سري في الزهد - ٤٥٤) ، (الطبري في تفسيره , و تاريخه - ١/٤٨٣) ، (تاريخ ابن عساكر ٨/١٣٣) ، (الرقة و البكاء لإبن أبي الدنيا ٣٣٩ - ٣٨٥) ، (الزهد لإبن مبارك - ٤٧٢) ، (التفسير لعبد الرزاق - ٢٥٨٥) ، (المروزي في تعظيم قدر الصلاة - ٢١) ، (الزهد لأحمد - ٧٣١) بسند صحيح ، (الطبقات لإبن سعد ٨/١٦٣) ، (التوابين لإبن قدامة ، تفسير البغوي عن الكلبي ).

## هەندێك ئەســەری ڕوون لــە سەلەفەوە لــەســەر جێگــیر بوونــی ئــەم باسە

أ- ابن موبارەک لە کتابی(الزهد - ٤٧٦) بەسەنەدێکی جيد لە موجاهیدەوە دەفەرموێت : هەڵەکەی داود عليه السلام لە دەستەکانی نەخشێنرابوو تاوەکو هەرکات دی بیری کەوێتەوە.

ب- ابن أبي الدنيا(٣٨٢)لە سولەیمانی تەیمیەوە دەڵێت : داود لەدوای ئەوە لەگەڵ ئەو کۆنەبووەوە.

ج- ابن أبي شيبة لة مصنف(٣١٨٩٢)بەسەنەدێکی جيد لەسەعيدی کوڕی جوبەيرەوە دەڵێت : فيتنەکەی داود تەنها هۆکەی سەير کردن بوو.

د- عبد الرزاق لـە تەفسيرەکەی(٢٥٨٧) لـە حەسەنـی بەصريەوە دەڵێـت : کاتێک داود بەخۆی زانی چ تاوانێکی کردوە ، چل شەو سوجدەی برد بۆ الله ، سەری بەرزەوە نەکـرد تەنهـا بـۆ نوێـژە فەڕزەکان نەبێـت ، وە تامـی خـواردن و خواردنـەوەی نەدەکرد تاوەکو الله وەحـی بـۆ کـرد کەپێـی فەرمـوو : سـەرت بەرزەوەبکە لێـت خۆشبـووم ، داود فەرمـووی : يـا ربـی مـن دەزانـم تۆ من ئاوا وازلێناهێنی تاوەکـو حەقـی ئەوبەندەم لێنەسێنيتەوە ، فـەرمووی : مـن پاداشتی بەندەکەم دايەوە و ڕازيم کرد و باشترين پاداشتم دايەوە لەبەرامبەر ئەوەی لە تـۆ ببورێت ، داود فەرمووی : ئێسە زانيم لێم خۆشبويت ، الله فەرمووی : (فغفرنا له ذلك وإن له عندنا لزلفى وحسن مآب).

حاکم هێناويەتی و صحيحيشی کردوە ، وە البيهى له الشعب الإيمان له إبن عباسەوە کە فەرمـووی : ئەوەی داود توشی هات لەدوای قەدەری الله کە لە سەری نووسيبوو تەنها بە هۆی موعجيب بوونـی بوو بە نەفسـی خـۆی ، ئەمەش دوای ئەوەی فەرمـووی : يا ربـی من شەو و ڕۆژ خەريکـی عيبادەت و پەرستنی تۆم ، الله ـش تاقی کردەوە.(الدرر لسيوطي).

ابن أبی الدنيا ڕيوايەتی کردوە لە (الرقة و البکاء - ٣٣٧)له ابن سابط ەوە ، وە ابن عساکر لـە تاريخەکـەی (٨/١٣٣.مختصر) : گـەر گريانـی داود و ئەهلـی زەوی بەراورد بکرێن لەدوای ئادەم ئەوا گريانی داود زياتـر دەبوو.

(البيهقي له الشعب – ٧٢٩) له وەهبی مونەبیهەوە فەرموویەتـی : کاتـێ داود توشی ئەو هەڵەبوو دووركەوتەوە لـە ئافرەتان ، بەردەوام خەریکـی عیبادەت بوو تاوەكوو لـە پـێ کەوت وە ڕووخساری جێگای فرمێسكەكانی پێوە دیاربوو له زۆری گریانیدا.

ابـن أبـی الدنیا ڕیوایەتـی كردوه لـە مالكـی كـوڕی دینارەوە(٣٩٩)داود دەیفەرمـوو : ئەی خەڵكینە ئافرەتـان دارێكـی تاڵن ، كاتێک تێدەپەڕن بە لاتاندا چاوەكانتان دابخەن و بیر لـە مردن بكەنەوە ، بۆئەوەی نەكەونە ئەو هەڵەی داود تێیكەوت.

ابـن أبـی الدنیا ڕیوایەتـی كردوە له (الرقة - ٣٩٤) : لەعبدالعزیزی كوڕی عومەرەوە وتـی : كاتێک داود توش ئەو هەڵەبوو هێندە گریـا دەنگ خۆشـەكەی نەما.

زۆرێک لـە كتابی سەلەف ئەم باسەیان گێڕاوەتەوە لە زانایانـی سەلەفەوە لـە وانە : كتابـي الزهد السري , كتابـي الرقة و البكاء لابـن ابـي الدنيا كه **٥٦** ئەسەری لەسەر هێناوە , العقوبات , ابن عساكر لـە تاریخەكەی , ابن قدامة لـە التوابين (١٧١).

بە ئیسنادیان لـە زۆرینەی سەلەفەوە لەوانە :

(سليمان التيمي , نوف الشامي , بكر بن عبد الله المزني , عبيد بن عمير و أبو قدامة الرملي , كعب الأحبار , ابن أبي رواد , يزيد الرقاشي , ثابت البناني , عمر بن زر عن أبيه , مالک بن دينار , أوزاعي , وليد بن مسلم , يونس بن خباب , شهر بن حوشب , وهب ابن منبه ) وە زۆرێكی دیش.

دەڵێین ئەم هەڵەی پێغەمبەر داود علیه السلام و تەوبەکەی کە هیچ تەوبەیەک نیە بەوێنەی ئەم تەوبەی داود لە بەنی ئادەم ، وە ئا لەم تەوبانەش ناکرێت بەبێ هیچ هۆکارێک ئەنجام درابێت ، وەک ئەوانەی ئینکاری ئەم باسەی داود دەکەن علیه السلام و دەڵێن داود علیه السلام هیچ هەڵەیەکی نەکردوە و هەموو ڕیوایەتەکان ڕەت ئەکەنەوە و نا ڕاستەوخۆ هەموو سەلەف بە درۆ و بوهتان تۆمەت باردەکەن.

لە کاتێکدا سەلەف لە سەدەکانی سەرەتادا ئەم باسەیان نقڵ کردوە و لە کتابەکانی تەفسیردا گێڕاویانەتەوە بەبێ ئینکاری کردن و قسەشیان لە سەنەدەکانیدا نەکردوە ئیدی متأخرین چیانە وا ڕەتی دەکەنەوە لە کاتێکدا سەلەف قەبووڵیان کردوە؟

بەڵام ئەوەی بەنی ئیسرائیل نوسیویانەتەوە لە تەورات و ئینجیلدا و ئێستە تێیدا مەوجودە کە داود علیه السلام زینای کردوە لەگەڵ ئەو ئافرەتەدا و دوگیان بوە ئافرەتەکە ، نعوذ بالله لەو دۆری داویانەتە پاڵ پێغەمبەرێک و درۆیان داوەتە پاڵ الله ، سەلەف کاتێک ئەمانەیان دەبیست زۆر بەتوندی ئینکاریان دەکرد ، وەک ابن مسعود و ئیمامی علی دەفەرموون : داود جگە لە تەماشاکردنی ئافرەتەکە هیچی دیکەی نەکرد.

وەک ڕوونمان کردەوە لە سەلەفەوە و کتابەکانیان ئەم باسەیان بەیان کردوە و ڕەتیان نەکردوەتەوە لە پاش ئەوان متأخرین هاتن و ئینکاریان کرد وەک هەموو باسەکانی دی وەک بڵێی ئەوان شارەزاترن لە سەلەف وەک بڵێی سەلەف ڕێزی پێغەمبەرانیان نەزانیوە ئەمان زانیویانە.

## ئەوانەی ئینکاریان کردوە

سەرەتای ئینکاری ئـەم باسە وەک هەمـوو باسەکانــی دی لە لایەن سەرانی موعتەزیلـە و ئەشعــەری و جەهمیەکانــەوە بــوو یەکەم کەسیــش ئینکاری ئــەم ئاسارانەی کــرد الزمخشري و الرازی بــوون ، ئەوانەش دوای ئەمان شوێنی ئەمان کەوتن و وازیان لە سەلەف هاورد و ئینکاری ئەم بەسەرهاتەیان کرد ( بیضاوي و ابن حيان و ابن العربي و الجصاص و الهراسي و القاضي عياض و أبو سعود والنسفي و ابن الجوزي و ابن عطية ابن خمير الأموي ) کە کتابە سەخفیەکانی نوســی و ناوی نــا (تنزيه الأنبياء مما نسب إليهم حثالة الأغبياء) سەلەف ناو دەبات بە گەمژە و نەزان کە خۆی لەو پەڕی نەزانی و کەم ئەدەبی دایە پاش ئەمانیش کۆمەڵێکی دیکە کاری گەربوون بەوانەی ئینکاری ئەم باسەدەکەن وەک (ابن كثير و صديــق حســن خان و الآلوسي) وە زۆر کتاب نوسراوە بــۆ ڕەت دانەوەی ئەم باسانەی کــە سەلەف بڕوایان پێ بووە.

لــە کۆتایدا دەڵێیــن : باسکردن و بەیان کردنی ئەم ڕووداو گەلانە بۆ ئاسان کردنــی تاوان و برەودان نیە بــە خراپە ، وە هیــچ کەسیش وا تێی ناگات تەنها ئەوانە نەبێت بۆنــی علمیشیان نەکردوە تا تێــی بگەن ، ئەمانە ئەو باسانەن کــە کتابەکانــی تەفسیری پێشەوایانــی ئومەت باسیان کــردوە و دەنکــی بوێریان بــۆ هەڵبڕیوە و لێوان لێون کتابەکانیان لەم ڕووداوە واقعیانە.

ئەوانەشــی دەڵێــن باسکردنی ئەم ڕووداوانە باشنیە حــەق وایە بڵێین : بــا خەڵکی قورئان بخوێنێتەوە بــەڵام مەچــن بەلای تەفسیردا بڤەیە ، ئــەی باشە کتابەکانــی تەفسیر بۆچــی باشن ئەوکات؟ سودیان چیە؟

بۆیە بەڕاستی ئەو پەڕی جەهالەتە بوترێت : با ئەم باسانە بشاردرێنەوە لە کاتێکدا کتابەکانی سەلەف و تەفسیر پڕن لەم باسانە وەک وتمان وە هیچ شەرم و کەمیەکی تێدانیە بۆ پێغەمبەران و موسڵمانان وەک ئەوەی هەندێک وا حاڵی بوون عیاذا باللە بۆیە دەیشارنەوە.

حەسەنی بەصری وتەیەکی جوانی هەیە کە دەفەرموێت : باسکردنی هەڵەی پێعەمبەران بۆ ئەوەیە خەڵکی نائومێد نەبێت لە ڕەحمەتی الله هەرچەندە تاوانیشیان زۆر بێت.

تفسیر البغوي.

وەرگێرانی : طارق الکردی

٢٩/٩/٢٠٢١ دوای عەسر